بسم الله الرحمن الرحيم

الحمدلله والصلاة والسلام على رسول الله وعلى آله وصحبه ومن والاه أما بعد:

بێگومان ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان پایەیەکە لە پایەکانی ئیسلام، بەجێ گەیاندنی لەسەر هەموو موسڵمانێکە تاکو بەتەواوی موسڵمان بێت، ئەم فەڕیزەیەش بەو شێوەیە بەئەنجام دێت کە مرۆڤی موسڵمان خۆی شارەزابکات لە گرنگترین حوکمانەی ڕۆژوو لە ڕەمەزاندا:

## پێناسەی ڕۆژوو

پێناسەی ڕۆژوو لە زمانەوانیدا: بریتییە لە خۆگرتنەوە لە شتێك جا ئەو شتە خواردن وخواردنەوە بێت، یان لە قسەکردن وەك الله تعالى دەفەرموێت: (فَإِمَّا تَرَيِنَّ مِنَ الْبَشَرِ أَحَدًا فَقُولِي إِنِّي نَذَرْتُ لِلرَّحْمَنِ صَوْمًا فَلَنْ أُكَلِّمَ الْيَوْمَ إِنْسِيًّا ) [سورة مريم: 26]. واتا: ئەگەر کەسێکت بینی و(پرسیاری لێ کردی)، ئەوە بە ئیشارەت تێی بگەیەنە پێی بڵێ: بەڕاستی من نەزرم کردووە بە ڕۆژووبم بۆ ڕەحمان، لەبەر ئەوە ئەمڕۆ من هەرگیز قسە لەگەڵ کەسدا ناکەم، مانای "صوما" لەم ئایەتەدا بە خۆگرتن لە قسە کردن هاتوە. [لسان العرب، لإبن منظور].

مانای ڕۆژوو لەشەرعدا: بریتیە لە خۆگرتنەوە لەوشتانەی ڕۆژوو دەشکێنن لە (خواردن وخواردنەوە وجیماع) لە نوێژی بەیانیەوە تا ئاوابونی خۆر، لەگەڵ بوونی نیەت.

## حوکمی ڕۆژوو

بەڕۆژوو بونی مانگی ڕەمەزان ڕوکنێکە لە ڕوکنەکانی ئیسلام، واجبە (فەڕز) لەسەر هەموو موسڵمانێك بە دەقی قورئان وسونەت وئیجماعی ئوممەت.

الله تعالى دەفەرموێت: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُتِبَ عَلَيْكُمُ الصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ} [البقرة: 183]. واتا: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە ڕۆژووتان لە سەر نوسراوە- واجب کراوە- وەك چۆن لەسەر ئەوانەی پێش ئێوە نوسراوە بەڵکو لە الله بترسن.

وە دەفەرموێت: {شَهْرُ رَمَضَانَ الَّذِي أُنْزِلَ فِيهِ الْقُرْآنُ هُدًى لِلنَّاسِ وَبَيِّنَاتٍ مِنَ الْهُدَى وَالْفُرْقَانِ فَمَنْ شَهِدَ مِنْكُمُ الشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ} [البقرة: 851]. واتا: مانگی ڕەمەزان (ئەو مانگەیە) کە قورئانی تیادا هاتۆتە خوارەوە، لەکاتێکدا ئەم قورئانە ڕێنموویی بەخشە بەخەڵکی وبەڵگەی زۆری تیادایە، لە ڕێنموویی وجیاکردنەوەی ڕاست وناڕاست وحەق وناحەق، جا کەسێك لە ئێوە مانگی ڕەمەزانی بینی (یان هەواڵی بینینی پێدرا)، دەبا ئەو مانگە بەڕۆژوو بێت.

وە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: "بني الإسلام على خمس، شهادة ان لا إله إلا الله وأن محمدا رسول الله، وإقام الصلاة، وإيتاء الزكاة، والحج، وصوم رمضان" [ متفق عليه].

واتا: ئیسلام بنیاتنراوە لەسەر پێنج پایە: شایەدی دان بەوەی هیچ پەرستراوێکی بە حەق نیە جگە لە الله، وەموحەمەدیش نێردراوە لەلایەین الله، لەگەڵ کردنی نوێژ وزەکات دان وحەج کردن وڕۆژووگرتنی ڕەمەزان.

وە ئوممەتی ئیسلامی ئیجماعیان لەسەر واجبێتی ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان کردوە لەسەر موسڵمانان وە گوتویانە هەرکەسێك ئینکاری لێ بکات کافرە. [مراتب الإجماع لإبن حزم الظاهري].



## مەرجەکانی واجب بوونی ڕۆژوو

ڕۆژوو واجب نیە تەنها لەسەر ئەمانە نەبێت:

1. موسڵمان: واتە لەسەر کافر واجب نیە.
2. ژیر: واتە لەسەر شێت واجب نیە.
3. پێگەیشتوو: واتە لەسەر منداڵ واجب نیە، بەڵام سونەتە ڕاهێنرێ تاکو گەیشتە تەمەنی باڵغ بون ئاسان بێت لەسەری.
4. تەندروست: واتە واجب نیە لەسەر نەخۆشێك کە ڕۆژووبونەکەی خراپتری بکات یان چاك بونەوەی دوا بخات.
5. نیشتەجێ بێت: واتە واجب نیە لەسەر کەسی موسافیر، بەڵام سونەتە بەڕۆژوو ببێت ئەگەر توشی ماندوبون وناخۆشی نەکات.
6. توانادار: واجب نیە لەسەر کەسێك توانای نەبێت، وەك بەساڵاچوو، یان نەخۆشێك ئومێدی چاك بونەوەی نەبێت، وئافرەتی دوو گیان وشیردەر ئەگەر بەڕۆژوو بونیان زیان بەخۆیان ومنداڵەکانیان بگەیەنێت، یان بەتەنها بە منداڵەکانیان.

## ڕوکنەکانی ڕۆژوو

1. نیەت: وە شوێنی دڵە، تەنها ئەوەندە بەسە لەیەکەم ڕۆژی مانگی ڕەمەزانەوە نیەتی ئەوەت هەبێت هەموو مانگەکە بەڕۆژوو بیت.

جا هەرکەس پارشێوی کرد بەمەبەستی ڕۆژووگرتن وخۆگرتنەوە لە خواردن وخواردنەوە ئەوە نیەتی هێناوە، وە هەموو خۆئامادەکردنێك وهاوشێوەکانی بە نیەت هێنان دادەنرێ وشوێنی نیەت دەگرێتەوە.

2. خۆگرتنەوە لەوشتانەی ڕۆژوو دەشکێنن: لە خواردن وخواردنەوە وجیماع واتا (خۆگرتنەوە لە ئارەزوەکانی سك وداوێن).
3. کات: وەکاتی بەڕۆژووبون لە دەرکەوتنی بەیانی ڕاستگۆوە (فجر الصادق) دەست پێ دەکات تا ئاوا بونی خۆر.

## گەورەیی ڕۆژوو

پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: "من صام رمضان إيمانا وإحتسابا غفر له ما تقدم من ذنبه " [رواه البخاري].

هەرکەسێك ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان بگرێت وباوەڕی وابێت ڕۆژووگرتنی فەڕزێکە لەلایەن الله و واجبە لەسەری، بۆ ئەوە بەڕۆژوو نەبێت کێشی دابەزێت یان چارەسەری نەخۆشی دەکات ..هتد ئەوا مەرجی یەکەمی فەرمودەکەی هێناوەتەدی لە خۆی کە بەرۆژووبونە بە ئیمانەوە، پاشان لەڕۆژوو گرتنەوەکەی نیازی ئەوەی هەبێت ئەجر وپاداشت وەربگرێ نەك مەبەستی ڕیا وناو بێت ئەوا مەرجی دووەمی فەرمودەکەی لە خۆی دا هێناوەتە دی، موژدەی بۆ هەیە لەلایەن پێغەمبەر ﷺ کە فەرمویەتی دەبێتە هۆی( لێ خۆشبونی هەموو ئەو گوناهانەی کردویەتی) إن شا ء الله.



## حیکمەتی ڕۆژوو

ڕۆژوو سوود وحیکمەتی زۆری هەیە، سەرچاوەی هەموو ئەو حیکمەتەی کە الله تعالى ڕۆژووی لەپێناودا فەڕز کردوە دەگەڕێتەوە بۆ (تەقوا)، وە بریتیە لە ئەنجامدانی فەرمانەکانی الله تعالى ودورکەوتنەوە وخۆپارێزی لە قەدەغەکراوەکانی.

الله تعالى دەفەرموێت: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُتِبَ عَلَيْكُمُ الصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ} ووشەی "لعل" لێرەدا بەمانای بەڵکو دێت واتا: بەهۆیەوە تەقوای الله بکەن، هەستان بەئەنجامدانی واجیباتەکان و وازهێنان لە حەڕام کراوەکانی الله.

## حوکمی وازهێنانی ڕۆژوو

هەرکەسێك ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان وازلێ بهێنێت بەهۆی بیانویەکی شەرعیەوە ئەوە هیچی لەسەر نیە، وەك بەڕۆژوو نەبون بەهۆی نەخۆشی یان سەفەرکردن، یان هەر بیانوویەکی شەرعی تر.

بەڵام کەسێك بەبێ بوونی بیانووی شەرعی، بەڕۆژوو نەبێت ئەوا سەیر دەکرێت: ئەگەر بەڕۆژوو نەبونەکەی بەهۆی ئارەزوو وشەهوەتی خواردن وخواردنەوە وجیماع کردنەوە بێت وە دان بنێت بەوەی ڕۆژووی ڕەمەزان واجبە وڕوکنێکە لە ڕوکنەکانی ئیسلام، ئەوا گوناهبارە وتاوانێکی گەورەی لە تاوانە گەورەکان ئەنجام داوە، وە ئەگەر بەڕۆژوو نەبونەکەی ئاشکرا لەبەرچاوی خەڵکی بێت ئەوا ئەبێتە (فاسق)ێکی ئاشکراکار بەتاوانەکەی.

زەهەبی دەڵێت: "لای بڕواداران جێگیربوە هەرکەسێك بەبێ بیانوی شەرعی، ڕەمەزان بەڕۆژوو نەبێت، ئەوا زۆر خراپترە لەوکەسەی زیناکارە و ئاڵودەیە بە مەی خواردن". [الكبائر]

بەڵام کەسێك ئینکاری بکات لە واجب بوونی ڕۆژوو بۆ نموونە بڵێ: ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان لە ئیسلامدا نیە، ئەوا کافرە بە کۆدەنگی زانایان"الفقهاء"، چونکە واجب بوونی ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان بەزەرورەت لە ئایندا زانراوە وڕوکنێکە ئیسلامی لەسەر بونیات نراوە، هەرکەسێك ئینکاری لێ بکات و بەڕۆژوو نەبونی بە حەڵاڵ بزانێت، ئەوا ئاینەکەی لە بنچینەدا هەڵوەشاندۆتەوە.

## سزای ڕۆژوو شکێن بەبێ بیانوی شەرعی

مەبەست لەوسزایە لێرەدا ئەوەیە کە لەدونیادا بەسەر کەسی ڕۆژوو شکێن دا دەدرێ، کە بەئەنقەست بەبێ بوونی بیانوی شەرعی ڕۆژووەکەی دەشکێنێت لە مانگی ڕەمەزان دا.

سزاکەش دابەش دەبێت بەپێی بیروباوەڕی کەسەکە سەبارەت بە ڕۆژوو:

ئەگەر کەسەکە بەبێ مۆڵەتی شەرعی وازی لەڕۆژووگرتنی ڕەمەزان هێنابێت، وئینکاری واجب بونی ڕۆژووی نەکردبێت ئەوا: سزا دەدرێ وتەمبێ دەکرێ بە جەڵدکردنی یان بەگرتنی وخواردن وخواردنەوەی لێ قەدەغەکردنی لە ڕۆژی ڕەمەزان، یاخود هەر سزایەك کە پێشەوای موسڵمانان بۆ ئەو کەسە وهاوشێوەکانی بەشایستەی بزانێت، بەڵام ئەگەر کەسێك وازی لە ڕۆژوو هێنابێت و واز لێ هێنانەکەی بەحەڵاڵ بزانێت ئەوا حوکمی کوشتنە.

شێخی ئیسلام ئیبنو تەیمیە دەڵێت: ئەگەر لە ڕەمەزان دا ڕۆژووەکەی بشکێنێت وبەحەڵاڵی بزانێت و زاناش بێت بە حەرامبونی وحەڵاڵی بکات ئەوە واجبە کوشتنی، بەڵام ئەگەر فاسق بێت ئەوا سزای شکاندنی ڕۆژووەکەی بەوشێوەیە دەبێت کە پێشەوا بەباشی دەزانێت.[مجموع الفتاوى].

## سونەتەکانی ڕۆژوو

سونەتەکانی ڕۆژوو زۆرن گرنگترینیان:

1. پارشێو کردن: سونەت وایە پارشێو دوابخرێ بۆ نزیك نوێژی بەیانی "طلوع الفجر".
2. پارانەوە : لەکاتی بەڕۆژووبون و ڕۆژوو شکاندن.
3. پەلەکردن لەشکاندنی ڕۆژوو دوای ئاوابوونی خۆر.
4. شکاندنی ڕۆژوو بە خورمای پێگەیشتوی تەڕ: سونەت وایە خواردنی بەشێوەی تاك بێت، وەئەگەر خورمای تەر نەبوو خورمای ووشك ئەگەر ئەوەش نەبوو بە ئاو.
5. ئامادەکردنی بەربانگ بۆ ڕۆژووەوان.
6. زۆرکردنی سونەتەکان: وەك (شەونوێژ وتەراویح وتەهەجود وخوێندنی قورئان، خێرکردن ومانەوە لە مزگەوت "الإعتكاف"...هتد)
7. پارێزگاری کردن لە ئەنجامدانی نوێژی بەکۆمەڵ لە مزگەوت...

جگە لەوانەش.

## ئەوشتانەی کەڕاهەتیان هەیە لە ڕۆژوودا

کەڕاهەتیان هەیە: واتە خراپن وباش نین.

1. زیادەڕۆیی کردن لەڕێگە پێدراوەکان، وەك زیادەڕۆیی کردن لە ئاو لەدەم ولوت وەردان وتام کردنی خواردن بێ پێویستی.
2. وازهێنان لە سونەتەکانی ڕۆژوو، وەك پێشخستنی پارشێو و دواخستنی بەربانگ.
3. زۆر قسە کردن: بەغەیری ویردی الله تعالى بەبێ بونی زەرورەت وبەزایەدانی کاتەکانی شەو بە گاڵتە وگەپ وباری.
4. بەردەوام بون لەسەر خوو ڕەوشتە خراپەکان: وەك حەسودی ورق وکینە ودرۆ، قسەی ناشرین و نەزەرکردنی حەرام...هتد

## ئەو شتانەی ڕۆژوو بەتاڵ ناکەنەوە

1. دواخستنی خۆشۆرینی لەشگران یان ئافرەتانی بێ نوێژ وزەیستان کاتێ پاك دەبنەوە بۆ دوای نوێژی بەیانی.
2. قوتدانی ئەو شتانەی کە ناتوانرێ خۆیان لێ بپارێزرێت، وەك قوتدانی تف وخۆڵ



وتۆزی ڕێگاوبان وهاوشێوەکانی.

3. تامکردنی خواردن لەبەر پێویستی (وەك پارچەکردنی خواردن یان کرینی یان خواردن دان بە منداڵ).
4. ئاوکردن بەسەرو لەشی ڕۆژووەوان وە خۆ خستنە ناو ئاو و خۆ نوقم کردن تیایدا.
5. خۆتیمارکردن وەك دەرزی لێدانی دەمار لە ماسولکە بدرێ یان سمت بەڵام بەمەرجێ دەرزی خۆراکی نەبێت وشتێك نەبێت بچێتە ناو سك.

## هەڵوەشێنەرەوەکانی ڕۆژوو

1. بەهەڵوەشانەوەی مەرجێك لە مەرجەکانی ڕاستی ودروستی ڕۆژوو، بەوەی موسڵمان مورتەد بێتەوە، یان کەسێکی عاقڵ هۆش و ژیری لەدەست بدات، یاخود ئافرەت بکەوێتە بێنوێژی وزەیستانی.
2. بەهەڵوەشانەوەی ڕوکنێك لە ڕوکنەکانی ڕۆژوو، وەك خواردن وخواردنەوە بە ئەنقەست (بەڵام بە لەبیرچوون ناشکێت) یاخود جیماع کردن وئاو هێنانەوە بەئەنقەست، (بەڵام توشبونی لەشگرانی لەڕۆژی ڕەمەزان ڕۆژووەکە بەتاڵ ناکاتەوە).
3. خۆ ڕشانەوە: بەڵام ئەگەر کەسێك ڕشانەوە زۆری بۆ هێنا ئەوا هیچی لەسەر نیە.
4. دەرکردنی خوێنی(کەڵەشاخ): بەبەڵگەی فەرمودەی پێغەمبەر ﷺ کە فەرمویەتی: "أفطر الحاجم و المحجوم"[صحيح رواه أبوداود وغيره]. واتا: ئەوەی خوێنی کەڵەشاخ دەردەکات وئەوەشی خوێنەکەی لێ دەردەکرێ ڕۆژووەکەیان شکاوە.

"الحاجم"ئەوکەسەیە خوێنەکە دەردەکات، جاران بەوجۆرە بوە کە مژی لە قاپی کەڵەشاخەکە دەگرت تاکو خوێنەکەی ڕابکێشێت، ئەگەری ئەوەی هەبوە ئەو خوێنە بچێتە سکیەوە، بەڵام چونکە ئێستا ئامێرەکان بەوجۆرە نەماوە، بۆیە ڕۆژووەکەی ناشکێنێت.

لە کۆتایی دا؛

ئەپاڕێینەوە لە الله تعالى ڕۆژوو وشەو نوێژ وجهاد وهەموو کردەوەکانمان لێ وەربگرێت، ئەم ڕەمەزانەمان بەرێبکەین لەژێر سێبەری خیلافەت وفەتح کردنی بەغداد ودیمەشق، لەگەڵ ئازادکردنی خوشك وبرا دیلەکانمان لە زیندانەکانی طاغوتان...

وصل اللهم على نبينا وعلى آله و صحبه أجمعين



